

محەمەد هەریری

# ئافرەتی کورد

## لەژێر هەژموونی گوتاری فیمینیزمی دا

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: عەبدولسەتار باغرەمەیی
چاپی ئیلکترۆنی یەکەم 2016



# ئافرەتی کورد

## لەژێر هەژموونی گوتاری فیمینیزمی دا

نووسینی: محەمەد هەریری

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە: عەبدولسەتار باغرەمەیی

چاپی ئیلکترۆنی یەکەم ٢٠١٦

# محەمەد هەریری

نووسینی: محەمەد هەریری

بابەت: توێژینەوە

وەرگێڕانی لە عەرەبیەوە: عەبدولسەتار باغرەمەیی

بەرگ: ئەبوبەکر مەلا

چاپ: چاپی ئیلکترۆنی یەکەم ٢٠١٦

# پێڕست

بەشی یەکەم

# ئافرەتی کورد
# لەژێر هەژموونی گوتاری فیمینیزمی دا

لەراستیدا نکوڵی لەوە ناکرێ کە جیهانی ئیسلامی بەتەواوی سنوورو جوگرافیا سیاسییەکەی، رۆڵێکی نەرێنی گوماناوی دەگێرێ، لەبەرامبەر هەژموونی کاراکتەری رۆژئاوا کە تا ئەوپەڕ متمانەی بەهەنگاوە قایم و جێگیرەکانی خۆیەتی، بەردەوامیش کاریگەری خۆی بەسەر ئەم جیهانەدا بەجێدێڵێ، لەوەتەی سەردەمی بەر لەداگیرکاری کۆڵۆنیالی.

هاوکات بەتێپەڕبوونی قۆناغی سەربەخۆیی نیشتمانی و نەتەوەیی و تائێستاکەشی لەگەڵدابێ، بەردەوام شارستانێتێ ئەم ناوچەیە روو لە پاشەکشەو پووکانەوەیە لە بواری بەرهەمهێنانی بەهاکان، بەشێوەیەك ئێستا ئەم ناوچەیە دەپڕژێتە سەر هەموو بیرۆکەو تیۆرو بەهایەك کە لەلایەن رۆژئاواوە بەرهەم دەهێنرێ تا وایلێهات لەلایەن بەشێك بە پیرۆز رادەگیردرێ و لەلایەن بەشێدیکەشەوە تا سەر ئێسقان رەتدەکرێتەوە.

نزیکەی بۆ ماوەی دوو دەیە دەچێ، لە رۆژئاوا کە نوێنەرایەتی ناوەندی شارستانێتی دەکات و بووەتە بەرهەمهێنەری شارستانێتی هیزرو تیۆرەکان، گرنگییەکی یەکجار گەورە دەدەرێ، بەو توێژینەوانەی تایبەتن، بە ژن و رۆڵ و ماف و مەرجەکانی ژیان و ئەو بزاڤ و لایەنانەی سەرکردایەتی ئەم ئاڕاستەیە دەکەن، هاوکات لەگەڵ گرنگیدان بە بەشداری ژنان لە بواری سیاسی و ئابووری و هەڵکردن لەگەڵ پێشهاتەکانی مۆدێرنەو کاریگەرییەکانی (فێمینیزم) لەسەرجەم بوارەکانی ژیان.

بێگومان پێشکەوتنی شارستانێتی مرۆڤایەتی وایلێهاتووە، هیچ بوارێك لە بوارەکانی بەجێنەهێڵدرێ بێئەوەی مرۆڤ سەری پێدانەکات، بەڵکو سەرجەمی بوارەکانی ژیانی مرۆڤایەتی ئێستا چووەتە ناو هاوکێشەی حیساباتەکان، لە دوێنێدا پرسی کۆیلایەتی زۆر گەرم بوو، لە ئەمڕۆشدا پرسی ژنان بەکۆی ئەوەی دەوری داوە لە کێشەو ستەم و تیۆرو ئەفسانەکانییەوە، بووەتە باسێکی گەرم و لە نێو نێوەندو

دامەزراوەکاندا گەنگەشە دەکرێ.
سەرنج بدە بزاڤەکانی ژنانی رۆژئاوا Feminism بریتین لەو بزاوتانەی هەر لە رۆژئاوا پەیدابوون و پەرەیانسەندوو، پاشانیش بە بەردەوامی بازاڕیان بۆ گەرمکرا. بۆیە بەهەر ناو و ناوەڕۆکێك بن. لەراستیدا گوزراشت لە سروشتی رۆژئاوا دەکەن، هەر بۆیە گرنگی ئەم توێژینەوانە لەوەدایە کە تائەوپەڕ هەوڵدەدا ئایدۆلۆژیاو تێڕوانینە هیزرییەکانی خۆی بەسەر تەواوی جیهان بەگشتی و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و جیهانی سێیەم لە ناویشیدا جیهانی ئیسلامی بەتایبەتر بسەپێنێ.
مایەی سەرسوڕمانی نیە، کاتێك دەبینی ئەو پەرتووکانەی تایبەتمەندن بە بورای توێژینەوەی تایبەت بە ژنان، تێیدا بەشێك یاخود زیاتر لە بەشێکیان تەرخانکراون بۆ باسکردنی ژنی موسڵمان و کێشەو پێشکەوتنی بارودۆخەکانی، بەگشتی ژنە نووسەرەکانی رۆژئاوا لە زۆرێك لە کتێبەکانیان کە تایبەتمەندن بە رەوشی ژنان باس لە بارودۆخی ژنانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و نیوەی باشووری گۆی زەوی دەکەن، بەڵام بارودۆخەکە بەبەراود لەگەڵ باسکردنەکە تەواو پێچەوانەیە، بەجۆرێك چارەسەری تێڕوانینەکان بۆ پرسی ژن، لەم ناوچانەدا جۆرە فزوڵییەتێکی تێدایە، بۆ وێنە ئەم ژنە نووسەرانەی رۆژئاوا خۆیان کردووەتە نموونەو پێشەنگی ژنانی جیهانی سێیەم و پەناهەندەکانی رۆژئاوا.
لەراستیدا بەئاشکرا جێ پەنجەو کاریگەری ئەم بزاڤانەی ژنان لە رۆژئاوا بەسەر بزاڤی ژنانی هەردوو جیهانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئیسلامیدا دیارە. بگرە کاریگەرییەکانی ئەم بزاڤانە تەواو دەبینرێ، لە تێڕوانینی نووسەرانی هەردوو رەگەز کە گرنگی بە توێژینەوەی تایبەت بە ژنان ئەنجام دەدەن، بەشێوەیەك نووسەرانی ئەم کتێبانە هەندێك جار بەشێوەیەکی پاڵفتەکراوو لە بەرگێکی نوێدا جوانکاری لە بیروبۆچوونەکانیان دەکەن.
تاوایلێدێ بەجۆرێك لەناو کۆمەڵێك ناوەندی رۆشنبیری نامۆ کە تەواو دوورە لە رەوشی ژنانی رۆژئاوا بەتەواوەتی پەسەند دەکرێ، ئەگەرچی ئەم پەسەندکردنەش یەکانگیرنەبێ لەگەڵ راستی و دروستی واقیعی کۆمەڵگەدا، بەڵام بەشێکی زۆر لە فیمینیستی کورد بێ خۆ پارێزی و سڵەمینەوە لەلای خۆیی کۆپی دەکات "بڕوانە ئەم گەمژەیی و بێ شەرمییەی یەکێك لە فیمینیستانی کورد، کاتێك قسە لەسەر فرەژنی دەکات، بەباشتری دەزانێ ژن لە بری ئەوەی سەر بەهەوێ شوو بە پیاوێك بکات، ئامێرێکی نیرینەی دەستکرد بەکاربێنێ، گەوجی ئەم فیمینیستە لەوەدایە، پێی وایە ئەوەی ژن و پیاو بەیەکەوە کۆدەکاتەوە تەنها بریتیە لە سێکیس، بێ ئەوەی سۆزو خۆشەویستی رەچاو بکات".
هاوڕێ لەگەڵ بزاڤەکانی ژنان لە رۆژئاواو بەشێکی دیکەی ئەو جۆرە بزاڤانە لە ناوخۆدا توانیویانە لێرەو لەوێ هەندێك دەستکەوت و سەرکەوتن بەدەست بێنن، بەڵام لە راستیدا ئەوەی ئەوان باسی لێوە دەکەن گوایە ژنانی کۆمەڵگاکانی جیهانی ئیسلامی، و جیهانی سێیەم و رۆژهەڵات بەگشتی کە لەوپەڕی شکۆو بەهاکانی مرۆییەوەدان، دووچاری ژیانێك بوونەتەوە تەواو پارێزخراوەو مەترسیدارە، بگرە رۆژانە بەناوی داب و نەریت و هەندێك جاریش بەناوی خودی ئاین لەسەر دەستی پیاوانی ئاینیدا رووبەڕووی چەوسانەوە دەبنەوە.

بۆیە لەسەر هەڵوێستێکی لەم شێوەیە، ئاساییە بەشێکی ڕێکخراوەکانی تایبەت بە ژنان لە هەرێمی کوردستان کاریگەربن، بەهەندێك بیروبۆچوونی ڕێکخراوەکانی ڕۆژئاوا، کە لە ڕاستیدا بیروبۆچونی ئەم ڕێکخراوانە هەرگیز نەگونجاوە لەگەڵ سیستەمی بەهای کۆمەڵگەی کوردی، بگرە نایەکانگیرە لەگەڵ تەواوی بەهاکانی جیهانی سێیەم، بە موسڵمان و مەسیحی و بودی و هیندۆسییەوە، چونکە بیروبۆچوونی ئەم ڕێکخراوانە ڕەچاوی تایبەتمەندی و کلتوری ڕۆشنبیری کۆمەڵگاکانی جیهانی سێیەمی نەکردووە، بگرە ژێر پێی خستوون، کەواتە دەرەنجام کێشەکە لێرەدایە.

مامەڵکردنی ئەم جۆرە گوتارە سەبارەت بە ژنان، بەشێوەیەکە کە تەواو جیاوازە لە خودی ژیانی مرۆڤایەتی، بگرە بەجۆرێك وێناکراوە پڕاوپڕیەتی دوژمنکاری و ئاستەنگ، کە بۆ تێکشکاندنی پێویستی بە جەنگێکی بەردەوام هەیە، بۆ ڕزگارکردنی ژن لە ستەمی سیستەمی پیاو سالاری پارترپارکی، هەروەها بەگوێرەی ئەم گوتارە پێویستە ئەم جەنگە بەردەوامی هەبێ، لە بەرامبەر تێکڕای ئایین و بەها کۆمەلآیەتی و یاسای پیاو سالاری پارترپارکی.

# سەرەتاکانی خەباتی ژنان

لەراستیدا بزاڤی بەرگریکردن و داکۆکیکردن لە مافی ژنان لە رۆژئاوا، بە ئامانجگەلێکەوە دەستی پێکرد، ئامانجە سەرەکییەکانی ئەم خەباتە بریتی بوو لە: پیادەکردنی یەکسانی لە نێوان ژن و پیاو و هەڵگرتنی زوڵم و چەوسانەی سەر ژنان بەگشتی. بێگومان لەگەڵ هەر دەستکەوت و سەرکەوتنێکدا، ئیتر چەندین بیرۆکەی نامۆو ناپەسەندو ناواقیعی سەرهەڵدەدات و زیاتر تەشەنەی دەکرد، بێ هیچ دوو دڵییەك وەکو خۆیان جێبەجێ کرابوونایە.

دەبوو چ شکستێك رووی لە کیان و بوونی مرۆڤایەتی بکردبووایە، شاراوەنیە بەشێکی ئەم بیرۆکانە بەهۆی کۆمەڵێك پاڵنەری ساختەو بەناوی کرانەوەی کۆمەڵگەی رۆژئاوایی دزەیان کردە ناو بیرو هۆشی خەڵکی بەگشتی، هەوڵدرا بەئاشکراو بێ سانسۆر پیادەبکرێ، لەناویشیاندا نێربازی و هاورەگەزبازی، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هێشتا لەناو زۆرینەی کۆمەڵگە ئەوروپییەکانیشەوە خۆپارێزی لێکرا، هەربۆیە بەهۆی ئەم خۆپارێزیەوە لە رووی یاسا رێگە بەپێیادەکردنی ئەم بیرۆکە ناپەسندانە نەدرا، لە ئەنجامدانیان بەشێوەیەکی ئاشکراو بانگەواز بۆ کردنیشیان.

ئاشکرایە لەوەتەی سەدەی نۆزدەهەمەوە چەندین بزاڤی تایبەت بەناوی جیاجیاو جیاوازی لە پێکهاتەی بونیادیانەوە، بۆ بەرگریکردتن لە مافی ژنان سەریانهەڵدا، هاوکات چەندین ئاراستەی دیکە هەن، کە سەرکردایەتی جیهان دەکەن بۆ ئازادی و بەرگریکردن لە ژنان، کە دواتر باسیان لێ دەکەین بۆ ئەوەی ببێتە دەروازەیەك بۆ ناسینی فیمینیزمی کوردی.

قورسە بتوانرێ پێناسەیەکی یەکگرتوو بۆ فیمینیزم دیاری بکەین، بەهۆی جۆراوجۆری فرەیی پێناسەکان کە بۆیکراوە. لەسەرەتادا پێناسەکە زۆر روون و ئاشکرایە، بەهۆی روونی و ئاشکرایی ئامانجەکانی خودی بزاڤەکانی رزگاری ژنان، بەڵام لەگەڵ بەستنەوەی بە فیمینیزم، پێناسەکە قورستر دەبێ، دواتریش بەستنەوەی بە پۆست فیمینیزم پێناسەکە دەبێتە مەتەڵێکی رووت.

بۆ وێنە سەبارەت بە فیمینیزم پێناسەکە بەم شێوەیە دەکرێ: "بیرۆکەی فیمینیزم لەسەر ئەم بنەمایە بونیادنراوە، کە کۆمەڵگە بەشێوەیەکی دادگەرانە مامەڵ لەگەڵ ژن ناکات، بۆیە فیمینیزم بەدوای هۆکارەکانی ئەم دۆخە دەگەڕێ، هەروەها چۆن ژن دەچەوسەندرێتەوەو هاوکات چۆن کاردەکات بۆدۆزینەوەی چارەسەر سەبارەت بە رزگارکردنی ژنان". (1) بەم شێوەیە فیمینیزم بریتیە لە دوو شت: یەکەمیان بلاوکردنەوەی هۆشیاری سەبارەت بە پێگەی ژنان لە کۆمەڵگەدا بەو چەشنەی کە مرۆڤە،

بەلاّم مرۆڤێکی زیان بەرکەوتوو و نایەکسان لەگەڵ پیاو، دووهەمیان بریتیە لە خواستی لابردنی ئەو زیانەی بەر ژن کەوتووە. (2)

لەراستیدا کەس نکوڵی لەوە ناکات کە کۆمەڵگە بەشێوەیەکی تەندروست مامەڵە لەگەڵ ژن بکات و ئەو زوڵم و ستەمەی لێیدەکرێ لەسەری هەڵبگیردرێ، هاوکات لەرووی ئەرك و مافیشەوە یەکسان بێ لەگەڵ پیاو، ئەگەر ئامم تێگەیشتنە وەك خۆی جێبەجێکرا هیچ کێشەیەك دروست نابێ، لەسەرێکی دیکەوە هەموو پیاوێکی تێگەیشتوو کە خاوەنی سەلیقەیەکی جوان بێ، بێ سڵەمینەوە شانبەشانی هەر ژنێکی دیکە پشتگیری لە خەباتێکی لەم شێوەیە دەکات. پیاوی دادگەر دەخوازێ خوشکەکەی، خێزان و کچەکەی ئازادبن و خاوەنی شکۆو کەسایەتی پایە بڵندو هەموو مافێکی خۆیان بن، بەلاّم کێشە لەو کاتە دەست پێدەکات کە ژنان تائەوپەڕ دوژمنکاری پیاوان دەکەن و دۆخێکی موزمین لە پێکدادانی نێوان هەردوو رەگەزی نێرو مێ دروست دەکەن کە بەبۆچوونی زۆرێك لە فیمینیستەکان بۆچوونیان وایە، پیاو سەرچاوەی نەخۆشییەکەیە لەم نێوەندەشدا کار دەکەن بۆ بنبڕکردن و ریشەکێکشکردنی جۆری رەگەزی مرۆڤ بوونەکەی، بگرە زیاتریش هەندێك تیۆری فیمنیستی هەیە، دەخوازێ ژنان دوور لە پیاوان بژین، یاخود بڕوانە ئەم بۆچوونە مندالاّنەییە کە داوای لەناوبردن و قڕکردنی پیاوان دەکات.

بەشی دووەم

# پۆست فێمینیزم

ئێستا با نموونەیەك سەبارەت بە پۆست فیمینیزم نیشان بدەین: بەبۆچوونی ئێمە فیمینیزم بریتی نیە لە کۆمەڵێك وەڵامی ئامادەکراوی پێش وەختەو پابەندبوون بە ئایدۆلۆژیایەکی دیاریکراو، بەڵکو بریتیە لە ئارەزوویەك بۆ بەدواداچوونی تایبەت بە ئەو، پرسێك کە ئەو ئاراستەو سەرکردایەتیمان دەکات، بۆ ئەوەی ئێمە پێیبگەین.

لەراستیدا فیمینیزم سوورە لەسەر پابەندکردنی ئێمە، بۆ بیستن و گوێگرتنی ئەزموونی خۆیان لە پێناو دووبارە بوونیادنانەوەی رەفتارو بیرکردنەوەی پیاوان. کەواتە دەرەنجام ئەم تێگەیشتنە بریتیە لە شێوازی داهێنانی پرسیارکردن. بێگومان فیمینیزم تەواو پابەندە بە بەرژەوەندییەکانی ژنان بۆ ئەوەی لەشوێنی سیستمی پارترپارکی، دادگەری راستەقینە کاری خۆی بکات، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێویست نیە پێش وەختە بەرژەوەندییەکانی ژنان بزانرێ. (3)

بەگشتی بەم شێوەیە هیچ بیرۆکەو ئایدۆلۆژیایەکی ناسراو بوونی نیە، بەڵکو تەواوی بابەت و پرسەکان بریتیە لە هونەری گوێگرتن لە پرسەکان و کۆمەڵێك پرسیاری نوێ کە پشت بە ئایدۆلۆژیای تاکە کەسی و هەوەسی پرسیارکارەوە دەبەستێ ! ئەمەش تەواو لەو تاقیکردنەوەیە دەچێ کە تێیدا پێویستە قوتابی پێشبینی هاتنەوەی هەموو شتێك بکات لە دەرزیەوە تاوەکو فرۆکە !

پێش ئەوەی دەست بەگێڕانەوەو باسکردنی قۆناغەکانی بزاڤەکانی ژنان بکەین، دەمانەوێ ئاماژە بەوە بدەین کە هەموو جۆرە دابەشکردنێکی تەقلیدی تایبەت بە بزاڤەکانی لیبڕالێ، سۆسیالیستی و رادیکاڵی و ئەوانیدیکە رەتدەکەینەوە، بەڵکو تەواو باوەڕمان وایە خەباتی ژنان لە پێناو مافەکانیان، بەسەر دوو بەش و دوو قۆناغی سەرەکی و دوو تێڕوانین و دیدگای جیاوازە دابەش دەبێ.

هەرچەندە تا ئێستاکە ئەم دوو ئاراستەیە هەست پێدەکەین، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا قیژەو هاواری فیمنیزمی رادیکاڵ کە لەژێر هەژموون و باڵی گوتەو تیۆرەکانی "مارکس و ئەنگلس و پۆست مارکسیزم"

بەرزبووەتەوە، هێشتا زۆر بەرزترو کاریگەرترە، لە کاری ئەو ژنانەی کە بەبێ دەنگی و لەسەرخۆ و بەتوانایەکی گەورەوە بێ ئاوارِدانەوەو گرنگی پێدانی ئەو تیۆرانەی ئاگری دوژمنایەتی خۆش دەکەن و جۆش بە هەوڵەکانی پووچگەرایی دەدەن، بە ئامانجی تێکدان و رووخانی ژیانی خێزان و کۆمەڵگە، کاردەکەن بۆ بەدیهێنان و دەستخستنی مافە بەدەست نەهاتووەکانی دیکەیان.

ئێستا قسە لەسەر ئاراستەی یەکەم دەکەین، کە پێی دەگوترێ بزاڤی رزگاری ژنان Women liberation movement، لەراستیدا ئەم ئاراستەیە لەناوخۆی سیستەمەکانی کۆمەڵگەدا کاردەکات، هاوکات هەوڵدەدات بۆ ئەنجامدانی چاکسازی و گۆرانکاری پێویست، لە ناویشیاندا دووپاتکردنەوە لەسەر مافی یەکسانی هەردوو رەگەزی نێرو مێ لەناو هەردوو کایەی سیاسی و فێربوون و بەشداری پێکردنی لە دەرفەتی کار، هەروەها داوا دەکات کۆتایی بهێنرێت، بەو جیاکاریانەی دەرهەق بە ژنان ئەنجام دەدرێ. بەبۆچوونی ئەم ئاراستەیە باشترین رێگە بۆ بەدەستهێنان و ئەنجامدانی چاکسازی پێویست بریتیە لە پلەبەندی کارکردن و ئارامگرتن و پێرۆکردنی سیاسەتی هەنگاو بەهەنگاو.

بێگومان مێژووی ئەم تێروانینە دەگەرێتەوە بۆ پەرتووکەکەی "ماری ۆڵسترۆنکۆفت" بەناوی "بەرگریکردن لە مافی ژن". ناوبراو پەرتووکەکەی لە ساڵی 1782 بلاوکردۆتەوە، هەروەها بە یەکەمین هەوڵ دادەنرێ کە تێیدا نووسەر رووی قسە لە رای گشتی دەکات، باس لە ستەم و پێشێلکردنی مافی ژنان دەکات، هاوکات داوای هەوڵێکی عەقلانی دەکات، بۆ گۆرینی تێروانینی کۆمەڵگا بەرامبەر ژن.

کە دەکرێ لەم نێوەندەدا پشت بەلایەنی فێربوون ببەسترێ، باشتریش وایە خەباتی بەردەوام هەبێ لە چوارچێوەی دامەزراوە شەرعی و یاسا ناوخۆییەکان و ئەنجامدانی چاکسازی تێیاندا. وەك زانراوە نووسەری کتێب "ماری ۆڵسترۆنکۆفت" هاوسەری "ویلیام کۆدۆین" فەیلەسووفی چاکسازی بووە. لەراستیدا پەرتووکەکەی "ماری" لە بنەرەتدا وەلامێك بوو، بۆ پەرتووکەکەی "ژان ژاك رۆسۆ" بەناوی "ئیمێل" کە لەبارەی پەروەدەوە نووسیویەتی.

لەو کتێبەدا بۆچوونی وایە، هەریەك لە پەروەردەی ئەخلاقی، دەروونی، عەقڵی و جەستەیی تایبەتمەندن بە رەگەزی نێر، لەو کاتەی باوەری وایە پەروەردەی رەگەزی مێ رەنگدانەوەی رەگەزی نێرە، ئامانج تێیدا بریتیە لە چێژ، خزمەتکردن و حەوانەوەی پیاوان. هەر بۆیە لەم سۆنگەیەوە "رۆسۆ" دووپات لەسەر ئەوە دەکاتەوە، بالا دەستی پیاوو ملکەچی و گوێرایەڵی ژن بۆ خواست و مەرامی پیاو، لە بنەرەتدا بریتیە لە سیستمێکی پێویست و سروشتی، نەك دەرەنجام و دەرهاوێشتەی پەروەردەی وەرگیراو "المکتسب". (4)

لێرەدا بیرکردنەوەی فیمینیستەکان لەگەڵ ئەو ژێرخانە نێگەتیڤەی هەردوو ئایینی یەهودی و مەسیحی، کە بۆ ژن وێنایان کردووە بەریەك دەکەون، بەو پێیەی بە بروای ئەو دوو ئایینە "ژن سەرچاوەی هەڵەی مرۆڤە". بروانە "ئافلاتوون" بەشێوەیەك پۆلینی ژنی کردووە کە لە خوار کۆیلە، شەرانگێز، شێت و نەخۆشەکان دایناوە.

کەسێکی وەك "دیکارت" لە میانی فەلسەفی دوانەییدا کە پشت بە عەقڵ و مادە دەبەستێ، باوەری

وایە عەقڵ پێدراوێکی تایبەتمەندە بە پیاو، لەو کاتەی مادە پەیوەستە بە ژن. لەلای خۆیەوە "کانت" بۆچوونی وایە، ژن لە پێکهاتە گشتییەکەی خۆیدا بەتایبەت لە توانا عەقڵییەکاندا تەواو لاوازە، کەسێکی وەك گەورە فەیلەسووفی شۆڕشی فەرەنسا "ژان ژاك رۆسۆ" دەڵێ :"ئافرەت تەنها لە پێناو سێکس و نەوە خستنەوە دروست کراوە"، لە کۆتاییشدا "فرۆید" پێشەنگی قوتابخانەی شیکاری دەروونی، وایدەبینێ کە کۆی گشتی کێشەکانی ژن پەیوەستە بە گرێکوێرەی خۆ بەکەمزانین بەرامبەر بە ئەندامی نێرینە". (5)

شاراوەنیە فیمینیزمی لیبراڵ، بەدەوری چوارچێوەی گشتی داخوازییەکانی بزاڤی رزگاری ژنان دەخولێتەوە، فیمینیزمی لیبراڵ بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانی ژنان، چوارچێوەو بەها مرۆییەکان نابەزێنێ، بەتایبەت کە ئەم شێوە فیمینیزمە باوەڕی بە بەها مرۆییە جێگیرەکان هەیە، سەبارەت بە ژن و بەشداریکردنی لە کایەکانی ژیان کە، لە راستیدا ئەم بەهایانە لەناو تەواوی رۆشنبیری و ئاینەکان دووپاتی لەسەر کراوەتەوە، باوەڕی بەوەیە خێزان کە لە بنەڕەتدا لە دایك و باوك پێکدێ، لانەیەکە بۆ بەردەوامیدان بەمانەوەی مرۆڤ بەشێوەیەکی تەندروست.

ئێستا ئەوەی لە فیمینیزمی لیبراڵ وەردەگیرێ، بریتیە لە ناونانی خۆی بە فیمینیزم کە لە بنەڕەتیشدا ئەم بزاڤە بریتیە لە بزاڤی رزگاری ژن، هۆکاری ئەوەی ناوی لەخۆی ناوە فیمینیزم، بۆ ئەوەیە لەگەڵ شەپۆلی فیمینیزمی رادیکاڵ هەڵبکات، لە کاتێکدا بەبۆچوونی ئێمە باشتروایە، فیمنیزمی لیبراڵ هەر بەناوە کلاسیکیەکەی خۆی بمێنێتەوە.

بێگومان هەندێك جار ناو رۆڵێکی گەورە دەگێڕێ، لە بە بازاڕکردنی بنەماگەلێکی دیاریکراو، بۆ وێنە کاتێك لە پەنجاکان، شەستەکان و حەفتاکانی سەدەی رابردوو بیری سۆسیالیستی گەیشتە لووتکە، زۆرێك لە پارت و کۆمەڵەو رۆشنبیران پاشکۆی سۆسیالیزمان بۆ خۆیان هەڵبژارد، بگرە ئەم دۆخە بەشێوەیك تەنی، کەسێکی وەك بیرمەندی ئیسلامی "مستەفا سوباعی" کەوتە ژێر هەژموونی بیری سۆسیالیستی و یەکێك لە پەرتووکەکانی ناونا " سۆسیالیستی ئیسلام".

# ئاراستەی فیمینیزمی رادیکاڵ

بەبۆچوونی هەندێك لە توێژەرانی بزاڤەکانی ژنان لە رۆژئاوا، بەتەواوی قوتابخانە جیاوازەکان بەشێوەیەکی گشتی و فیمینیزمی رادیکاڵ بەتایبەتر پچڕانێکی مەعریفی "ئیپستمۆلۆژی" لەسەر ئاستی تیۆری و جۆری، لەگەڵ بزاڤەکانی رزگاری ژنان Women liberation movement پێکدەهێنێ، بەشێوەیەك هەرگیز یەکانگیر نابێتەوە لەگەڵ ئەو نەزعە سروشتیەی، کە داوای هەلی یەکسانی لە نێوان هەردوو رەگەزدا دەکات، و دەخوازێ یەکسانی یاسایی لە نێوانیاندا بەرقەراربێت، و زوڵم و ستەم لەسەر ژن هەڵبگیردرێ.

هاوکات لەگەڵ ئەوەی رۆژئاوا باوەڕی بە ناوەندێتی بەهای مادی رەها هەیەو بەردەوام لەسەر ئەو هێڵە هەنگاو دەنێ، و لەسەر حیسابی بەها مرۆیی و مەعنەویەکانیش لەسەر فەلسەفەو تیۆرو تێڕوانینە میکانیکیە مادیەکان خۆی بونیاد دەنێت.

هاوشانی ئەم ئاڕاستەیە فیمینیزمی رادیکاڵ، بەهەموو ئەو باکگراوندو بیرۆکەو تێڕوانینە نامۆو توندڕۆییانەی هەیەتی، بووەتە دەرهاوێشتەیەکی شەرعی تەواوی ئەو فەلسەفەو بیرۆکانەی جیهانی رۆژئاوا کە تاسەر ئێسقان دژایەتی نەزعەی هیومانیزم یاخود مرۆڤ بوون دەکات. هەموو پێداگری و جەختکردنەوەیەکی فیمینیزمی رادیکاڵ، لەو تیۆرەدا چڕبۆتەوە کە باوەڕی بە سیستمی ژن سالاری (ماتریارکی)یەوە هەیە، بۆ ئەوەی شوێنی سیستمی پیاو سالاری (پارتریارکی) کە ناسراوە بەسیستمی هێز بگرێتەوە.

هەروەها فیمینیزمی رادیکاڵ باوەڕی وایە سیستمی پارتریارکی دیاردەیەکەو گۆڕانی مێژوویی بەسەردا هاتووە. هاوکات لەمیانی چەمکی جێندەرو دووبارە بونیادنانەوەی کۆمەڵگە بەشێوەیەکی ریشەیی و دەستاو دەستپێکردنی رۆڵ و پێگەی پیاو و ژن کە تائێستا پیاو رۆڵی سەرکردایەتی بینیوە، فیمینیزمی رادیکاڵ هەوڵ دەدات کۆتایی بەدەسەڵاتی پیاو سالاری بێنێ. ئەوەی جێی سەرنجە، فیمینیزمی رادیکاڵ تەواو باوەڕی وایە، سیستمی باوك سالاری سەرچاوەی کێشەو گرفتەکەیە، هەرچی فیمینیزمی لیبراڵە وایدەبینێ کێشەکە بریتیە لە یاسا، هاوکات لە دیدی خۆشییەوە فیمینیزمی مارکسی پێی وایە کێشەکە بریتیە لە ململانێی چینایەتی.

## بەشی سێیەم

# فیمینیزم و کەلەپووری مارکسی

لەراستیدا کەلەپووری فەلسەفەی مارکسی یەکەمین سەرچاوەی فیمینیزمی رادیکاڵە، چونکە خودی ئەم فەلسەفەیە جەخت لەسەر سروشتی ململانێی نێوان هەردوو رەگەزی نێرو مێ دەکاتەوە.. لە تێروانینی هەریەکە لە "سان سیمۆن" و "فۆریە" کە دوو فەیلەسوفی فەرەنسین، مارکسیەت بریتیە لە –شار- هەروەها "لینین" دووپاتی دەکاتەوە "فەلسەفەی مارکسی میراتگری شەرعی ئەوپەڕی داهێنانی فەلسەفەی مرۆڤایەتیە لە سەدەی نۆزدەهەمدا کە بریتیە لە فەلسەفەی ئەڵمانی و ئابووری سیاسی ئینگلیزی و سۆسیالیستی فەرەنسی".

یەکەمین کەسێك کە زاراوەی "رزگاری ژن"ی بەکارهێنا "فۆریە"ی فەرەنسی بوو، خاوەنی ئەو گوتە بەناوبانگەی کە مارکسیەت کردیە دروشمی سەرەکی خۆیی: "لەراستیدا پێوەری راستەقینە بۆ پێشخستنی هەر کۆمەڵگایەك، پەیوەستە بە ئاستی پێشکەوتنی ژنانی ئەو کۆمەڵگایە".

هەروەها پەرتووکی "کۆمەڵگای کۆن" کە هی "مۆرگان ئەنجلسی"ی مارکسیە، باس لە کۆمەڵگای ژن سالاری "مارترياريکی" دەکات، کاتێك لە ساڵی 1877 ئەم پەرتووکەی مۆرگان بڵاوبۆوە، مارکس دوای خوێندنەوەی 98 لاپەڕە تێبینی لەسەر نووسیوە، پاشان دوای مردنی مارکس "ئەنگلس" هەستا بە کۆکردنەوەی تێبینیەکانی مارکس، لەگەڵ چەند تێبینیەکی دیکەی خۆی لە دوتوێی پەرتووکێك بەناوی "ریشەی خێزان و موڵکداریێتی تایبەت و دەوڵەت لەژێر رۆشنایی توێژینەوەکانی مۆرگان" بڵاوکردەوە، چاپی یەکەمیشی لە زیورخی پایتەختی سویسرا لەساڵی 1884 دەرچوو. هەروەها پرۆفیسۆر "میشێل .ل" جەخت دەکاتەوە کە مارکس بەشێوەیەکی بژاردەیی زانیاری لە پەرتووکەکەی مۆرگان وەرگرتووە، بەمەبەستی خزمەتکردنی مەبەستەکانی خۆیی و بیرۆکەکانی پێشووی، زیاتر لەوەش بەم شێوەیە

نیشانیداوە کە خودی مۆرگان یەکێك بوو لەوانەی سەرسام بوو بە بۆچوونەکانی ئەنگلس. (6)
گرنگترین ئەو تێڕوانینانەی مارکس لە پەرتووکی "کۆمەڵگای کۆن" ی مۆرگان وەریگرتووە، بریتیە لە تیۆری کۆمەڵگای پیاو سالاری "مارتریاریکی" کە پوختەکەی بریتیە لەم چەند دریڕە: "لەسەرەتای دەستپێکی مێژووی مرۆڤایەتی هەر یەك لە رەگەزی نێرو مێ لەژێر سایەی پەیوەندییەکی ئازادی سێکسیدا بەیەکەوە دەژیان، هەروەها بەهۆی ئەوەی باوکەکان منداڵەکانی خۆیان نەناسیوە، بۆیە ناسین و بەخێوکردنی منداڵەکان لە ئەستۆی دایکان بوو، بەم پێیە کۆمەڵگا بووەتە کۆمەڵگایەکی ژن سالاری تەواو و لەژێر سایەی جینۆکراسی – دەسەڵاتی ژن –ژیاوە".
پاشان دوای ئەوەی پیاوان کشتوکاڵ و بەخێوکردنی ئاژەڵیان دۆزییەوە، کودەتایان بەسەر ژندا کردووەو توانیان دەسەڵاتی پیاو سالاری پارتریارکی دابمەزرێنن. جێگەی تێڕامانە توێژینەوە مەیدانیەکەی مۆرگان ماوەی 20 ساڵی خایاند، باسەکانی تەنها لەکۆمەڵگەی "ئێرکوا" کۆمەڵگای سەرەتایی هیندە سوورەکان کورتکردەوە، کە بۆچوونی وایە لە کۆمەڵگاکانی سەرەتایی ژن سالاری پێڕۆکراوە. لەکاتێکدا کەس گومانی لەوە نیە، کە سەدان بگرە هەزاران کۆمەڵگای دیکە بوونیان هەبووەو مۆرگان دەستی بۆ نەبردووەو تێیدا کۆمەڵگاگەلێك بوونە پیاو سالاری پێڕۆکراوە. ئەگەر باوەڕمان بەو کۆتێشینانەی مارکس کرد کە دەیانداتە پاڵ مۆرگان.
لەراستیدا پێشتر زۆرینەی بزاڤەکانی فیمینیزمی رادیکاڵ خۆیان بە بەشێك لەچەپ داناوە، بەڵام ئەم دۆخە درێژەی نەکێشا، بگرە بەپێچەوانەوە هەر زۆر ئاسان چەپیان تۆمەتبارکرد، بەوەی پێڕۆی سیستمی پیاو سالاری دەکات، لە کاتێکدا خودی لۆژیك و ململانێی فیمنیزمی رادیکاڵ سەرچاوەی لە ململانێی چینایەتی مارکس وەرگرتووە، بگرە زیاتریش لەو تێڕوانینە، بەبۆچوونی مارکس یەکەمین ململانێی چینایەتی لە مێژوودا لە ناو خێزان، لە نێوان پیاو و ژن سەریهەڵداوە، بەجۆرێك پیاو گوزارشتی لە چینی بۆرژوا کردووە، ژنیش پرۆلیتاریا!
سەرەڕای ئەم هەڵوێستە هێشتا رەخنەیەکی زۆر لە فیمینیزمی رادیکاڵی مارکسی دەگیردرێ، بەهۆی گەورەکردنی ململانێی چینایەتی لەسەر حیسابی ململانێی نێوان پیاو و ژن، بەڵام لەسەرێکیدیکەوە هەندێك فیمینیستی دیکەی هاوشێوەی "رۆزا لۆکسمبۆرگ" و"ئەلیکساندەر کۆلۆنتای" کار دەکەن لە پێناو گونجانی نێوان رادیکاڵی و مارکسی، لە میانی دۆزینەوەی پەیوەندی نێوان پارتریارکی و ململانێی چینایەتی.

# باوکانی مارکسی ئەوانەی دەستیان
# بە ململانێی نێوان هەردوو رەگەزەکە چۆن بوون؟!

راستە باوکانی کۆنی مارکسیزم خاوەنی تیۆری ململانێی چینایەتی بوون و ژیانی خێزانیشیان بەهەمان پێوەر پێوانە کرد، دواتریش فیمینیزمی رادیکاڵ ململانێی نێوان هەردوو رەگەزی نێرو مێی لەناو هەمان ناوچەدا گەرمتر کرد، بەڵام جێگەی تێڕامانە باوانی کۆنی مارکسیزم لە ژیانی تایبەتی خۆیاندا، لە ناو خێزانەکانیاندا نموونەی رێزو پیرۆزی بوونە، بەشێوەیەك خودی "مارکس" تائەوپەڕ "جینی" هاوسەری خۆشویستووە، تا دەگاتە ئەوەی ئەم خۆشەویستیە "ئەنگلز"ی هێناوەتە گۆو مردنی جینی بە مردنی (مۆر) کە نازناوی مارکس بووە بچوێنێ وبڵێ :"بەڕاستی بە مردنی جینی، مۆریش کۆچی کرد ".

هەروەها کاتێك لە ساڵی 1885 "ئێدگار"ی کوڕی مارکس دەمرێ، مارکس لە نامەیەکدا کە بۆ "ئەنگلز"ی نووسیوە دەڵێ :"لەراستیدا ماڵەکەمان دوای مردنی کوڕە خۆشەویستەکەم، کە هێمای زیندوێتی و رۆحی خانەوادەکەمان بوو، ئێستا بووەتە کەلاوەو جەستەیەکی بێ گیان.. ئێستا بە مردنی کوڕەکەم راستەقینەی موسیبەت دەناسم.. ". (7)

هەروەها کاتێك "لیزا" ی هاوڕێی نزیك و هاوبەشی ژیانی "ئەنگڵس" دەمرێ، مارکس سەرەخۆشی لێناکات، بەو هۆیەوە ئەنگلز زۆر لە مارکس تورە دەبێ، کە هەرگیز لە ژیانی هاورێیەتیاندا تورەبوونی بەم شێوەیە لە نێوانیان روونەداوە، بگرە ئەنگڵز مارکس تۆمەتبار دەکات بەوەی کە کەسێکی بێ هەستە.

سەرنج بدە، کەسێکی وەك "لینین" کە تاسەر تێکۆشا لە پێناو بنبڕکردنی دیاردەی خێزان، کەچی گەورە بیرمەندی شیوعی "ریازانۆڤ" دەڵێ :"لینین هاوسەرەکەی دەپەرست". (8)

بڕوانە ئەندازیاری دژایەتیکردنی خێزان بەو پێیەی یەکەیەکی مرۆیی و قەوارەیەکی مێژووییە، هاوکات بە توندی رەخنەی لە حکومەت گرتووە، بەهۆی ئەوەی دەستەوسان وەستاوە لە دژایەتیکردنی خێزان و هەڵوەشاندنەوەی، کەچی دەڵێ :

"لە جیاتی ئەوەی رژێم بایەخ بدات بە پێشخستنی سیاسەتی سۆسیالستی لە نێوان خەڵکدا، هەڵدەستێت بە گەڕاندنەوەی ڕێز وئیعتیبار بۆ خێزان، کە لەبنەڕەتدا بەخراپی بونیادنراوە، پێویست ناکات رێگە لە هەڵوەشانەوەی بگرین". هەروەها دەڵێ :" لەراستیدا شۆڕشی هەوڵێکی ئازایانەیە بە مەبەستی لەناوبردنی خێزان کە دامەزراوەیەکی کۆن و داڕزاو پێکدێنێ، کە تێیدا ژن ناچار دەکات لەناو ماڵ کاری قورس ئەنجام بدات و رزگار بکرێ لە کۆت و بەندە ئەزەلییەکانی ناو ماڵ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا

هەوڵەكانی سەركەوتوو نەبوون بۆ سڕینەوەی خێزان، بەهۆی پاشەكشەكردنی خەڵك لە چێشتخانە گشتییەكان و گەڕانەوەیان بۆ ماڵ و سەر خوانی خێزانەكانیان، هەروەها بەكارهێنانی شوشتنگەو گەرماوە گشتییەكان بەهۆی دزینی جل و بەرگەكانیان، سەیربكە ئەم پیاوە چۆن دوژمنێكی سەرسەختی خێزان بووە، بەڵام ئەوەی تێبینی دەكرێ بەڕادەیەك هاوسەرو كوڕەكەی زۆر خۆشویستووە كە باوەڕ ناكرێ، دەبینی كاتێك كوڕەكەی "لیڤۆڤیچ سیدۆڤ" لە ساڵی 1958 لە دۆخێكی نادیاردا دەكوژرێ، لەگەڵ هاوسەرەكەی وەكو پرسە بۆ ماوەی چەند رۆژێك دەرگای ماڵەكەیان دادەخەن، ئا لەو كاتەدا قسەیەكی كاریگەر دەكات و دەڵێ :" بەڕاستی لیۆنی كوڕم بەشێكی ئێمە بوو، بگرە بەشێكی هەرە گەنج و سەوز بوو، ئێستا بەمردنی ئەو، هەموو شتە سەوزو گەنجەكان كۆتاییان پێهات". (9)

# دروستکراو شۆڕش بەسەر دروستکەرەکەی دەکات

جێگەی سەرنجە فیمینیزمی رادیکاڵ، تەنها بەخۆ پڕکردن لە تیۆرەکانی مارکسی تێرنەبوو، بەڵکو زۆر پەرگیرتر بوو، تا ئەو ئاستەی مارکسیزم بە تیۆری "نێر سالاری" تۆمەتبار دەکات، لە کاتێکدا خودی ئەو جۆرو شێوە چەمك و زاراوانەی لە مارکس و قوتابخانە فەلسەفییەکەی وەرگرتبوو.
فیمینیزمی رادیکاڵ توانی چەمك و زاراوەی تازە بەرهەم بێنێ، لەوانە زاراوەی "جێندەر" کە زۆر مەترسیدارەو خوازیارە گۆڕانی جۆری لە هەردوو رەگەزدا ئەنجام بدات، بۆ ئەوەی لە ناوەڕۆکدا مێ ببێتە نێرو بە پێچەوانەشەوە، هەرچەندیشە هەردوو رەگەز لە بنەڕەتدا لە هەردوو رووی فسیۆلۆژی و سایکۆلۆژیشەوە تەواو جیاوازن لە یەکتری.
لەلای خۆیەوە "نیما ناگیبی" ی کچە توێژەر دوویات لەسەر ئەوە دەکاتەوە، لووتکەو ترۆپکی شەپۆلی دووەمی فیمینیزم بەشێوەیەکی گشتی دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی بڵاوبوونەوەی پەرتووکەکەی "کێت میلێیت" kate millett لەبارەی سیاسەتی رەگەزی Sexual politics کە کاری خۆی کرد بەسەر زۆرێك لە بیرۆکە تیۆرییەکان کە کاریگەریان بەسەر شەپۆلی دووەمەوە هەبوو، هاوکات بووە سەرچاوەی بەشێکی دیکەی فیمینیستەکان بۆ بەرەنگاربوونەوەو بەگژداچوونەوەی پەرتووکەکەی "سیمۆن دی بۆڤوار" بەناوی "رەگەزی دووەم" و لە ساڵی 1949 بلاوبوویەوە، کە خودی ئەم پەرتووکە بەدامەزرێنەری زاراوەی "جێندەر" دادەنرێ و پەرگیرترین زاراوەیەکیشە لە بۆتەی فیمینیزمەوە دەرچووبێ.

**بەشی چوارەم**

# وێنای ئافرەتی رۆژهەڵاتی لە دیدگای رۆژئاوا بەگشتی و فیمینیزم بەتایبەتی

لەراستیدا جگە لە ژنانی کورد، زۆرێك لە چالاکوانی ژنان لەبارەی وێنای نێگەتیڤی ژنان لە دەرەوەی جیهانی رۆژئاوایان نووسیوەو رەخنەی ئازایانەو بابەتیشیان گرتووە، سەرەڕای بڵاوبوونەوەی ئەم جۆرە گوتارو پەرتوکانە کە بە تێڕوانینێکی کۆلۆنیاڵی تایبەت بە ژنانی رۆژئاوا نووسراون، بەڵام هەرگیز گوێمان لە فیمنیزمی کوردی نەبووە، هیچ لەبارەی ئەو پڕۆژانەوە بڵێ، نەیتوانیوە هیچ رەخنەیەکی گشتیش لەبارەی تێڕوانینی فیمینیستانەوە بگرن، بەڵکو ئەوەی کردوویانە تەنها هاتوون، قسە لەسەر ژنی رۆژئاوایی دەکەن بەو پێیەی باشترین و ناوازەترین نموونەیەکە بۆ چاولێکردن.

لەکاتێکدا ئەوەی فیمینیزمی رۆژئاوا دەیڵێ و دووبارەی دەکاتەوە، بەتەنها گوزارشت لە راستەقینەی ژنی سپی پێست دەکات و هیچیتر، چونکە ژنی رەش پێست لە دۆڵێکی دیکەدا دەخوێنێ. بەڵام لە راستیدا "نیما ناگیبی" توانیویەتی لە میانی دەرخستنی وێنای نێگەتیڤ و ناشیرینکراوی ژنی موسڵمان لە چاوی رۆژئاوا بەگشتی و فیمینیزمەکەی بەتایبەتی کە لەسەر هەردوو بنەمای کۆلۆنیاڵی و تەبشیری دروست بووەو بەردەوامیش خۆی پێ باڵاترە لە ژنی رۆژهەڵاتی و ژنی موسڵمان، دەستنیشانی کرۆکی کێشەکە بکات.

لەمبارەیەوە دەنووسێ :"لەدیدی رۆژئاواو فیمینیزمی رۆژئاوا، ژنی موسڵمان وێنایەکی رەهای لە چەوسانەوەو دواکەوتوویی هەیە، بەشێوەیەك شوێن و پێگەی ژنی رۆژئاوای لە سەدەی نۆزدەهەمدا

گرتۆتەوە. لەراستیدا ئەم تێڕوانینەی فیمینیزمی رۆژئاوا هەمان پرۆژە کۆلۆنیالیەکەیەو تەنها پاوانخوازیەکەی بۆ پیاوان هێشتۆتەوە.

بێگومان بەهۆی قۆستنەوەی رەگەزی مێینەی خۆیان و تەوزیفکردنی رەگەزەکەیان، ژنانی رۆژئاوا دەتوانن بچنە شوێنەکانی تایبەت بە ژنان لە رۆژهەلات، پاشان ناسینی نەتەوەو پێکهاتەو نەژادە جیاوازەکانی رۆژهەلات. دواتریش لەژێر دروشمگەلێکی بۆیە کراوو رازاوەی تایبەت بەخۆیان، وەکو "ئەنتوانێت پێرتۆن" ناوی ناوە "نەنگییەکانی ژنانی سپی پێست" دێن، ژنانی موسڵمان بەئامادەگی نووری مەسیح فریو دەدەن، بۆئەوەی پێیان بڵێن لەژێر سیستمی ئیسلام رزگارتان دەکەین.

لەراستیدا تائێستا گوتاری "فیمینیزمی تەبشیری" کاریگەری بەسەر هەڵمەتەکانی ژنانی رۆژئاواوە هەیە، بەئامانجی "رزگارکردنی ژنان" لە وڵاتانی ئیسلامیداو ئازادکردنیان لە بەندیخانەی بالاپۆشی ئیسلامی.

شاراوە نیە نەزعەی فیمینیزمی رۆژئاوا کە بەردەوام کار دەکات، لە پێناو رزگارکردنی ژنانی موسڵمان لە بیروباوەڕی ئایینی خۆیان، یاخود وێنایەکی ئیسلامیان پیشاندەدا، گوایە ئیسلام ناتوانێ لەگەڵ رەوتی ژن هەڵبکات، چەندین جار ئەم جۆرە هەڵمەتە توندانەی فیمینیزمی رۆژئاوا، وایکردووە نەتوانرێ لە رێگەی ئاڵوگۆڕی رۆشنبیرییەکان هاوپەیمانێتی نێوان ژنانی جیهان دروست بێ. بێگومان گرفت و ئاستەنگی سەرەکی نموونەیەکی لەم شێوەیە، پەیوەندی بە نایەکسانی هەیکەلی پەیوەندییەکەوە هەیە، کە کۆڵەگەکەی بریتیە لەو گریمانەی باوەڕی بە فزولییەتی کۆمەڵێك لە ژنان هەیە کە زۆر پێشکەوتووترو رۆشنگەرترن لە کۆمەڵەیەکی دیکە. لەراستیدا قسەکردن لەسەر نموونەیەکی لەم چەشنە، کە پێیوایە ستەم و چەوسانەوەی ژنان پرسێکی جیهانیەو بریتیە لە نموونەو تێڕوانینێك، دێ پۆلینی ژنان دەکات بەسەر نەتەوەو ئاینە جیاوازەکان.

لەراستیدا بەهەند وەرگرتن و پیاهەڵدانی نموونەیەکی لەم شێوەیە، کە پێیوایە ستەم و چەوسانەوەی ژنان پرسێکی جیهانیە، لەکاتێکدا خودی ئەم نموونەیە دێ ژنان بەسەر نەتەوەو ئاینەکان پۆلین دەکات. ئاشکرایە ئەم نموونەیە ریشەکەی بۆ مێژووی پەرتووکەکانی هەردوو سەدەی هەژدەهەم و نۆزدەهەم دەگەڕێتەوە، هاوکات لەسەردەمی ئێستاکەش بەردەوامی هەیەو گوزارشت لە دیدگاو گوتاری بەشێك لە فیمینیستەکان دەکات.

هەروەها ئەم نموونەیە کە تایبەتمەندە بە پەیوەندی پۆلین بەندی ژنان لە ماوەی شەپۆلی دووەمی فیمنیزمی ئەمەریکی و ئەوروپی، زیاتر گەشەی سەندوو بە لووتکە گەیشت.

یەکێك لە شێوە تایبەتەکانی گوتاری فیمینیزمی رۆژئاوا بریتیە لە دووپاتکردنەوە لەسەر هەڵوەشانەوەو لێکترازانی پەیوەندی خوشکایەتی لە نێوان ژنانی جیهان و دامەزراندنی پەیوەندی پلەبەندی و پۆلین بەندی وەکو ئەلتەرناتیڤ، کە تێیدا ژنانی رۆژئاوا لووتکەی هەرەمی پۆلین بەندییەکە داگیر دەکات، بەوپێیەی ژنانی رۆژئاوا تەرزێکی تایبەتن و نموونەیەکی دەگمەنن بۆ چاولێکردن و لاساییکردنەوەی لەلایەن نەتەوە، ئاین و رۆشنبیرییەکانی دیکە، بەتایبەت ژنانی موسڵمان . لەساڵی 1984 هەر یەك لە

"ڤالێری ئامۆس" و "پراتیبا پارما" گوتارێکی گرنگیان بڵاوکردەوە، تێیدا هەردوولا دووپاتیان کردەوە ئەو توێژینەوانەی کە ژنانی جیهانی سێیەم لەناوخۆیاندا تاوتوێی دەکەن و زیاتریش باسی خۆشگوزەرانی و بەختەوەری و دەستکەوتی ژنانی سپی پێستی ژنانی رۆژئاوا دەکەن، لەراستیدا توێژینەوەگەلێکن لە جەوهەردا گوزارشت لە ستەم و ئیمپریالیزم دەکەن. (10)

پێشتر هەریەك لە لەیلا ئەحمەد، ڤالێری ئامۆس، پراتیبا پارما، کۆماری چایاو ئاردینا، مارینا لازاریق، چاندرا تاڵبید مۆهانتی، گایاتری چاکراڤۆرتی سپیڤاك و چەندینیتر رەخنەیان ئاڕاستەی فیمینیزمی دامەزراوەیی کرد، بەوپێیەی بریتیە لە بانگەشەی دامەزراوەی نێودەوڵەتی فیمینیزم کە لەلایەن رژێم و سیستەمەکانی وڵاتانەوە دانپێنراوەو بە زمان و بەناوی خوشکانی جیهانیشەوە قسە دەکات.

کە لە راستیدا بریتیە لە دیوێکی دیکەی نێگەتیڤی رەگەزی مێ، کە پشت بە وجودی قەوارەی فیمینیزمی رۆژئاوا دەبەستێ، قەوارەیەك تائەوپەڕ لە خۆشگوزەرانی و چێژو دەستکەوتی جۆراو جۆرەوە مەست بووە. ئێستا ئەوەی ئەو قەڵەم بەدەستانە تێبینیان کردوو داخی بۆ دەکێشن، بریتیە لەوەی کە بەرێژەیەکی زۆر فیمنیزمی رۆژئاوا گرنگی بە دۆخی ژنانی وڵاتانی ئیسلامی دەدات.

لەلایەکی دیکەوە گوتارێکی گرنگ و کاریگەری "چاندرا مۆهانتی" هەیە، بەناوی "توێژینەوەکان لەبارەی فیمینیزم و وتارەکانی کۆڵۆنیالی" کە هەمان بابەتی سەرەوە گەنگەشە دەکات، بەبۆچوونی مۆهانتی گوتاری توێژینەوەی فیمینیزمی رۆژئاوا پیادەی داگیرکاری و پاوانخوازی و قۆستنەوەی ژنانی جیهانی سێیەم دەکات، لە میانی یەکخستنی قەوارەو دەستەی "ژنان" . لەو نموونانەی مۆهانتی پێشکەشی دەکات، بریتیە لە وێنای ژنانی موسڵمانی بالاپۆش، لەناو یەك دەستەی جێگیرداو، بەو پێیەی تەواو ستەم لێکراوە.

بەڕاستی مۆهانتی رەخنە لە پرۆژەی سیاسی بزووتنەوەی فیمینیزمی رۆژئاوا دەگرێ، کە خەریکی هەڵوەشانەوەی "تاك قەوارەیی ژن"ە وەکو قەوارەیەکی هاوچەشن و یەکگرتوو، لە بریشیدا دروستکردنی زاراوەگەلێکی تازەی نموونەی "ژنانی جیهانی سێیەم" هەروەها باس لەوە دەکات کە بزووتنەوەی فیمینیزمی رۆژئاوا، کاردەکات لە پێناو تاریکاندنی وێنای ژنان لە بەشێکی زەوی و هەروەها نیشاندانی لایەنێکی رۆشن لەسەر دۆخی ژنان لە بەشێکی دیکەی زەویدا، لە کاتێکدا کە ستەم و سەرکوتکردن بەشێوەیەك هەمەجۆرە باوەڕ ناکرێ، هاوکات پەیوەستیشە بە مێژوو، جوگرافیاو کلتوور.

شاراوەنیە پەرتووکەکەی "مارینا لازاریق" بەناوی "رەوانێژی بێدەنگی: ژنانی جەزائیر جێگەی پرسیارن" کە لە ساڵی 1994 بلاویکردەوە، رەخنەیەکی رادەبەدەر لە پۆلینکاری و داتاشینی زاراوەکانی "ژنانی موسڵمان، ژنانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست" دەگرێ، بە بۆچوونی لازاریق مەیلی پاڵنەری پۆلینکردن، کۆکردنەوەو ئامادەکردنی ژمارەیەکی زۆری ژنان لە تەواوی نەتەوە، ئاین و رۆشنبیریە جیاوازەکان، و دانیان لەناو یەك تاکە سەبەتە، تا ئەوپەڕ مانای خۆبەزلزانی و لووتبەرزی تێدایە، بۆیە لەسەر گوتاری فیمینیزمی رۆژئاوا پێویستە رووبەڕووی هەر جۆرە پۆلینکارییەکی لەم چەشنە ببێتەوە.

لەلایەکی دیکەوە "لەیلا ئەحمەد" لەمیانی بڵاوبوونەوەی گوتارێکی، لە ساڵی 1982 بەناوی "ناوەندێتی

ڕۆژئـاواو تێڕوانینـی قەدەغەکـراو" بـە تونـدی ڕەخنـە لـە توێژینەوەکانـی فیمینیزمـی ڕۆژئـاوا دەگـرێ، سـەبارەت بـەو تێڕوانینـەی کـە بۆ ژنانی موسـڵمان هەیەتی، دوویات لەسـەر ئـەوە دەکاتـەوە ژنانـی ڕۆژئـاوا بەگشـتی و ژنـی ئەمەریکـی بەتایبەتـی، بەتەنهـا ڕەوایەتـی بەخـۆی داوە قسـە لەسـەر ژنانـی موسـڵمان و سـتەم و چەوسـاوەکانی سـەری بـکات و بیانناسـێت.

بەشـێوەیەك لەنـاو توێژینەوەکانیـان بـاس لـە ژیانـی سـتەم، چەوسـانەوەو زیندانـی ژنانـی موسـڵمان دەکـەن، بێئـەوەی لەسـەرێکی دیکـەوە کار بـکات و تواناکانـی بخاتەگـەڕ لـە پێنـاو لێکتێگەیشـتنی تـەواوی ڕۆشـنبیری، کلتـوور و داب و نەریتەکانـی جیهانـی ئیسـلامی.

"لەیـلا" ڕوونـی دەکاتـەوە زمانـی فیمینیـزم کـە بەرگـری پیاوانـی بەریتانیـای لـە ئینگلتـەرا خرۆشـاند، هەمـان ئـەو زمانـە بەکارهاتووەیـە بـە ئامانجـی خزمەتکردنـی پـرۆژەی داگیـرکاری کۆڵۆنیالـی. لەراسـتیدا لـۆرد "کرامـەر" کـە دامەزرێنـەرو سـەرۆکی "پەیوەنـدی پیـاوان" بـوو لـە بەرامبـەر دژایەتیکردنـی مافـی ژنـان، لـە بەشـداریکردن و دەنگـدان لـە هەڵبژاردنـەکان، هـاوکات یەکێکیـش بـوو لـەو کەسـە سەرسـەختانەی بەئاشـکرا پشـتگیری لـە ڕزگارکردنـی ژنانـی باڵاپۆشـی میسـری دەکـرد.

لەیلا بۆچوونی وایە ماناو واتا هەمەجۆرەکانی "باڵاپۆشـی" گوتـاری فیمینیزمـی ڕۆژئـاوای دروسـتکردووە، بەتایبـەت پێناسـەکردنی "باڵاپۆشـی" بـەو پێیـەی سـیمبولی بەرگرییـە لـە سـەروەری بـاوەڕو مانـەوە لـە بەرامبـەر هەژموونـی ئیمپریالیـزم، لـە بەرامبـەردا ڕۆژئـاوا هەمـان تێڕوانینـی هەیـەو پێـی وایـە، باڵاپۆشـی سـیمبولی بـە کەمزانیـن و ژێرپێخسـتنی ژنـە لـە ئیسـلام.

## بەشی پێنجەم

# زڕاندنی ناوی کورد لە پەنا فێنیزمدا

بڕوانە بەهۆی نەبوونی گیانی ڕەخنەو هەستی نەتەوایەتی و ئایینی، فیمینیزمی کوردی بووەتە کۆپییەکی دووبارەی فیمینیزمی ڕۆژئاواو بەردەوام بەرهەمەکانی دووبارە دەکاتەوەو تێڕوانینەکانی بڵاودەکاتەوە، پەلاماروهێرشەکانیشی بۆ سەر خود درێژەیان هەیەو بەشێوەیەکی ترسناك و کوێرانە نەتەوەو تێڕوانینەکانی کۆمەڵگای کوردی و پیاوی کورد ناوزڕاو دەکات، لەم نێوەندەدا بەشێوەیەکی کلۆڵ و کرچ و کاڵ بەدرێژایی شەوو ڕۆژ ژنی کورد ڕووبەڕووی گوتارێکی پفدراوی کۆڵۆنیالی دەبێتەوە. ئەم گوتارە وەکو ئەوەی حەقیقەتی ڕەها لەلای ئەو بێ، بۆیە دەخوازێ هەموو ئەوەی کۆمەڵگا لە پەیوەندی نێوان ژن و پیاو باوەڕی پێیەتی و پیادەی دەکات، بێسڵەمینەوە بەچاو تروکانێك لە ریشەوە هەمووی هەڵتەکێنێ.

بەبۆچوونی "چاندرا مۆهانتی" بەریگریکار لە مافی ژنانی هیندی، ئەم گوتارە جۆرێکی نوێیە لە "تەبشیری ئیمپریالیزم"، بەڵام لە بەرگی مێینەدا بۆ ئەوەی بێز لە هەموو کلتور و بیروباوڕو ئایینێکی خۆماڵی بکات و لێیان هەڵبگەڕێتەوە، لە کاتێکدا لەیادی چووە یاخود هەر حیسابی بۆ نەکردووە، کە ژن بەر لەوەی مێ بێ، مرۆڤەو دەکۆشێ لە پێناو مانەوەی هەموو مەیلە مرۆییەکان، وەکو چۆن ئارەزووی مادی هەیە، هاوکات ئارەزووی ڕۆحی و غەریزەی ئاینیشی هەیە.

بێگومان فیمینیزمی کوردی هەوڵدەدا بەم جۆرە گوتارە کۆڵۆنیالیە بەهەمان نەفەسی ڕۆژئاوا قسە لەسەر پرسەکانی تایبەت بە ژنان بکات لە کۆمەڵگەی کوردیدا، کە ئەگەری ئەوەی لێدەکرێ قبوڵی ئەم گوتارە پفدراوە بکات.

بۆیە بەبۆچوونی ئێمە فیمنیزمی کوردی لە ڕێگەی پێشکەشکردن و گواستنەوەی کەسایەتی ئەم جۆرە گوتارانە کە ڕاستەوخۆ بەر پێکهاتەی تایبەتی ئەم ناوچەیە دەکەوێ، زیانێکی زۆری بە پرسی ژنان گەیاندووە، لە کاتێکدا لەم قۆناغەدا ژنی کورد ئەوپەڕی پێویستی بەهەر جۆرە بەرگریلێکردنێکی عەقڵانی لەسەرخۆ هەیە، لە گرنگترین ئەو پرسانەیشی فیمینیزمی کوردی قسەی لەسەر دەکات،

بریتیە لەم چەند پرسەی خوارەوە:

## کوشتنی ژن بەناوی شەرەف لە کۆمەڵگەی کوردیدا

لەراستیدا دیاردەی کوشتنی ژنان بەناوی شەرەف، بەرێژەیەك لە هەموو کۆمەڵگا ئیسلامییەکان و هەندێکجار لە کۆمەڵگا نائیسلامییەکانیش بوونی هەیەو کەسیش نکوڵی لەم راستیە ناکات، زیاتر لەچەند سەرچاوەیەك ئاماژە بەوە دەکەن، بگرە ئەم دیاردەیە لە کۆمارە ئیسلامییەکانی یەکێتی سۆڤییەتی جارانیش پیادە دەکرا، بەتایبەت هەر کات کچان و ژنان، کارتێکراو دەبن بە چەمکی فیمینیزمی مارکسی، دەست دەکەن بەخۆ رزگارکردن لە هەموو جۆرە کۆت و بەندێکی کۆمەڵایەتی و ئایینی، وەکاتێك پێچەوانەی بیروباوەڕی نەتەوەکەیان دەردەکەوتن و وانیشانیان دەدا لایەنگیری داگیرکاری بیانین، کە خاك و شەرەفیانی داگیرکردووە، زۆربەی جاران ئاکامیان بە کوشتن کۆتایی دەهات.

شاراوەنیە ئەم دیاردەیە بەشێوەیەکی زیاتر لە ولاتانی دواکەوتوو بوونی هەیە، بەلام بگرە لە زۆرێك لەولاتانی پێشکەوتووی ئیسلامیش پیادە دەکرێ. ئەوەی سەیرە فیمینیزمی کوردی لە کوردستانی عێراق و ئێران بەشێوەیەکی زۆر زەق نیشانی دەدات "کوشتنی ژن بەناوی شەرەف" تەنها کێشەیەکی تایبەتە بە پیاوی کورد، بەشێوەیەك جگە لە پیاوی کورد لە کۆمەڵگاکانی رۆژهەلات پیاو ژن ناکوژێ. کچە نووسەر "بامێلا کۆنستاپڵ" وتارێکی سەبارەت بە "کوشتنی ژنان بەناوی شەرەف" نووسیوە، لەسەرەتای وتارەکەیدا باسی چیرۆکی ژنێکی پاکستانی بەناوی "پەروین" دەکات، کە بووەتە قوربانی ئەم جۆرە کوشتنە، کاتێك پیاوەکەی بە تۆمەتی خیانەتی هاوسەری تۆمەتباری دەکات، و پاشان سزای دەدات و رووخساری دەشێوێنێت زامداری دەکات.

دواتر پاش تەواو بوونی دادگا سکالای لەدژ بەرزدەکاتەوە. لە درێژەی وتارەکەیدا "کۆنستاپڵ" باس لەوە دەکات، ئەم چیرۆکە تەنها نموونەیەکە، هەزاران ژنی پاکستانی تر بەدەستی باوك و براو پیاوەکانیان ئەشکەنجەدراون، یاخود سووتێنراون بە پاساوی ئەوەی خانەوادەکانیان سەرشۆڕ دەکەن، کاتێك خیانەتی هاوسەری دەکەن، یاخود داوای جیابوونەوەی مێردەکانیان دەکەن، یان لەگەڵ خۆشەویستەکەی ڕای کردوە، یانیش رەتی هاوسەرگیریەك دەکەنەوە کە خێزان و خانەوادەکانیان بۆیان هەڵبژاردوون.

کەواتە لەوێش ئەو رووداوە کە بە ئەشکەنجەو سووتان کۆتایی پێدێ، پێی دەگوترێ "کوشتن بەناوی شەرەف". نووسەر باوەڕی وایە ئەم جۆرە تاوانانە بەهۆی غیرەی پیاوان لەسەرتاسەری جیهان بوونی هەیە، بەلام جیاوازییەکەی پەیوەستە بە شێوازی مامەڵەی حکومەتەکان لەگەڵ ئەم جۆرە تاوانانە.

بۆ نموونە لە زۆرێك لە ولاتانی ئیسلامی ئەم تاوانە روودەدات بێئەوەی هاوارو دەنگی ناڕەزایی لێبکەوێتەوە.

نووسەر لە وتارەکەیدا ئاماژەی بۆ ئەوە کردووە تەنها لە ساڵی 1998 – 1999 لە هەرێمی "پونجاب"

لە وڵاتی پاکستان 850 حاڵەتی کوشتن روویداوە، هەروەها لە هەمان بەرواردا 560 حاڵەی سووتان هەبووە. نووسەر روونیکردۆتەوە ئەو ژنانەی تۆمەتبارن بە خیانەتی هاوسەری یاخود ئەوانەی داوای جیابوونەوەیان کردووە لە ترسی ئەشکەنجەو رووبەڕووبوونەوە لە دەرەوە، پەنایان بردۆتە بەر شوێنە تایبەتەکان کە حکومەت وەك پەناگەی ژنان دایمەزراندوون، بەم شێوەیە ئەگەری دووبارە شووکردنەوەی ئەم ژنانە دەبێتە مەحاڵ.

لە کۆتاییدا وتارەکە هەندێك داتای تایبەتی لەو وڵاتانە تۆمەتبار کردووە، کە تێیدا پێشێلی مافەکانی ژنان کراوە بەناوی "کوشتن لە پێناو شەرەف" داتاکەش بەم شێوەیە بووە: بەنگلادیش 1996 – 1998 بە میوەی حامز تێزاب  هێرش کرایە سەر 200 ژن، لە ساڵی 1997 لە وڵاتی میسر 52 تاوان ئەنجامدراوە هەندێکیان لەلایەن دایکانەوە بووە، لە ساڵی 1998 لە وڵاتی ئوردن 30 حاڵەتی کوشتن بە ناوی شەرەف هەبووە، بۆیە دواتر داوایەکی زۆر بەرزبۆوە بە مەبەستی هەڵوەشاندنەوەی ئەو مادە یاساییەی بکوژەکەی تەبرئە دەکرد لە تاوانەکەی.

لە نێوان ساڵانی 1996 – 1998 لە لوبنان 36 حاڵەتی کوشتن هەبووە، زۆربەیشیان لە گوندەکان روویانداوە، هەروەها لە هەمان ساڵدا 300 حاڵەتی دیکەی کوشتن لە وڵاتی پاکستان هەبووە، لە کەرتی غەززە لە فەڵەستین لە ساڵی 1996 – 1998 نزیکەی 239 تاوانی کوشتنی ژنان بە پاساوی شەرەف هەبووە، بە گوێرەی ئامارەکانی رێکخراوەکانی ئافرەتان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باشووری رۆژئاوای ئاسیا زیاتر لە 200 هەزار کوشتن هەبووە. (12)

# کوشتن بە ناوی شەرەف تایبەتمەند نیە بە ژن

ئەوەی تائێستا فیمینیستەکان لێی بێئاگان، کوشتنی کوڕ و پیاوانە بەناوی شەرەف، لەلایەن بنەماڵەو خانەوادەکانیان. هەروەك چۆن ژنێك بە پاساوی پەیوەندی ناشەرعی لەگەڵ پیاوێکی بێگانەوە لەلایەن خانەوادەکەی دەکوژرێ، بەهەمان شێوە پیاوانیش بە پاساوی هەبوونی هەمان پەیوەندی ناشەرعی لەگەڵ ژنانی بێگانە لەسەردەستی خانەوادەی ژنەکەوە دەکوژرێ، بگرە زۆر جاران کاردانەوەی زۆر نابەجێ و ناشایستە دەرهەق بە پیاوان کراوە.

بۆ نموونە ئەنجامدانی دەستدرێژی سێکسی بەرامبەر بە پیاوان. سەرنجی دیمەنی ئەم گەوجیە بدە، کاتێك کۆمەڵێك پیاو لە خانەوادەی کچێك پەلاماری کوڕێك دەدەن، بەبیانووی ئەوەی دوو جار چووەتە خوازبێنی کچەکەیان! ئێستا بڕوانە دیمەنی دووەم کەخۆم بەباشی لەیادمە کاتێك یەکێك لە کوڕانی خانەوادەی کچێك، چۆن و بەچ شێوەیەك هێرش دەکاتە سەر کوڕێکی هەرزەکار کە تەمەنی تەنها چواردە بەهار بوو، و دواتر کوشتی، بە بیانووی ئەوەی تەنها نامەیەکی بۆ کچەکەیان نووسیوە. کەواتە بەم دەرەنجامە ڕووندەبێتەوە، کە کوشتن بەناوی شەرەف تەنها پەیوەست نیە بە ژن، بەڵکو پیاوانیش بوونەتە قوربانی.

لە ڕاپرسییەکدا کە لە نێوان هەر یەك لە ئاینی ئیسلام، مەسیحی، سیخ و هیندۆسەوە ئەنجامدراوە، لە نێوان هەر 10کەسێك یەکێك گوتوویەتی: کاتێك خێزانەکەم ڕووبەڕووی هەڕەشەی شەرەف دەبێتەوە، ئامادەم دەستدرێژکارەکە بکوژم، کەواتە ڕوون دەبێتەوە کوشتن بەناوی شەرەف، ڕیشەکەی هێندەی پەیوەندی بە ڕۆشنبیری کۆمەڵایەتی هەیە، ئەوەندە پەیوەندی بە ئایینەوە نییە. (13)

یەکێکی دیکە لە هۆکارەکانی تاوانی کوشتن بەناوی شەرەف، هاوڕەگەزبازیە **Homosexulity** دیارە بەهۆی ئەم مەیل و نەزعە ڕەگەزییانەشەوە زۆرێك دەکوژرێن.

ئێستا ئەوەی جێگەی سەرنج و تێڕامانە کاتێك دەبینین تاوانەکانی کوشتن بەناوی شەرەف تەنها لە وڵاتانی ئیسلامی ڕوونادات، بەڵکو لە وڵاتانی دیکەی وەکو بەرازیل هەمان دیاردە بوونی هەیە، بەتایبەت کاتێك کوڕێك ڕەگەزی خۆی بۆ ڕەگەزی مێ دەگۆڕێ، یاخود بە پێچەوانەوە کچێك ڕەگەزی خۆی بۆ ڕەگەزی نێر دەگۆڕێ، کەواتە تاوانی کوشتن بەناوی شەرەف ڕەگی لەناو کلتوری وڵاتانی ئەمەریکای لاتینیشەوە هەیە، بەڵام پێی دەگوترێ **Machismo** کە زاراوەیەکە واتای پایەبەرزی و

دەسەلآتی پیاو بەسەر ژن دەگەیەنێ. بگرە هاوڕەگەزبازی لە هەردوو رەگەزی نێرو مێ رووبەڕووی توندوتیژی دەبنەوە، تا کار دەگاتە کوشتنیان، یاخود ناچار دەبن خۆیان بکوژن.

کەسێکی وەك "ژولی مێرتۆس" دەڵێ :"تا ساڵی 1999 لە وڵاتی بەڕازیل کوشتنی ئافرەتان بە تاوان دانەدەنرا، بەڵکو کوشتنێك بوو بە ناوی پاراستنی شەرەف، بەشێوەیەك تەنها لە ماوەی یەك ساڵدا 800 ژن لەلایەن مێردەکانیانەوە کوژراون، هەروەها تا ساڵی 1980 کوشتنی ئەو ئافرەتانەی لەشفرۆشیان دەکرد یاسایی بوو. (14)

کەواتە بەم شێوەیە کوشتن بەناوی پاراستنی شەرەف داهێنراوێك نیە لەلایەن کوردەوە داهێنرابێ، وەکو ئەوەی فیمینیستانی کورد جیهانیان لێ پڕکردووە، بە مەبەستی تاوانبار کردنی پیاوی کورد.

بەشی شەشەم

# ژن خاوەنی جەستەی خۆیەتی

بەزۆری فیمینیستانی کورد باس لە پێویستی و ئازادی ژن دەکەن، لە مامەڵکردنی بەجەستەی خۆی، ئەم بۆچوونە مانای وایە، ژن ئازادە هەرکات بیەوێ پەیوەندی لەگەڵ کەسێك ببەستێ، گرنگیش نیە پەیوەندییەکە لە چوارچێوەی پرۆسەی هاوسەرگیری بێ یاخود لە دەرەوەی ئەم پرۆسەیەبێ، یانیش ئەو هەر تەواو ئازادو سەربەستە لە هەڵبژاردنی شێوەی شووکردنەکەی کە ئایا شوو بە پیاو دەکات، یان بە ژنێکی هاوڕەگەزی خۆی، بۆیە بۆ کەس نیە دەست لەم خواستە کەسییەی وەربدات و رێگری لێبکات.

بڕوانە لەمبارەیەوە فیمینیستی کوردی بەبێ گەڕانەوە بۆ بەهاکانی کۆمەڵگەکەی کە جیاوازە لە بەهاکانی هەر کۆمەڵگەیەکی دیکەی رۆژئاوا، راستەوخۆ دێ دەست بە سوانەوەو بەکارهێنانەوەی هەمان زمانی ئاخاوتنی فیمینیستی رۆژئاوا دەکاتەوە، بۆ وێنە پێگەیەکی ئەلیکترۆنی فیمینیستانی کورد.

گرتەیەکی ڤیدیۆیی فیمینیستێکی رۆژئاوایی بڵاوکردۆتەوە، تێیدا ژنێك هەموو سنوورێکی بەهادار دەبەزێنێ و دەڵێ :"ئەوە جەستەی خۆمە نەك هی تۆ، چۆنم بوێ بەم جۆرە بەکاری دەهێنم، ئازادم پەیوەندی لەگەڵ هەر کەس دەبەستم کە خۆشم دەوێ، بەلامەوە گرنگ نیە ئەوەی شووی پێدەکەم پیاوە یان ژن، چونکە من ئازادم و خاوەنی جەستەی خۆمم". (16) ئەوەی جێگەی سەرنجە فیمینیستی کورد دەیەوێ لەمیانی ئەم گرتە ڤیدیۆیەدا، هانی ژنی کورد بدات تا بەهاکان ببەزێنێ و لە دەرەوەی هەر پرۆسەیەکی شەرعی و یاسایی هاوسەرگیری ئەنجام بدات.

لەراستیدا پێشنیازو خستنەرووی ئەم پرسە هەستیارانەی وەکو شەرەف و سەرکۆنەکردن و رەتکردنەوەی

چەمکی شەرەف لەناو کۆمەڵگەیەکدا، کە زۆرینەی تاکەکانی ئامادەن لە پێناویدا بێ چۆن و چوون بمرن، هەروا ئاسان نیە، چونکە پیاوی رۆژهەڵاتی بەگشتی و بەهەمەجۆری کلتووریەکانیەوە، هەرگیز بەم سانایيە کە فیمنیستی کورد، عەرەب، تورك، فارس و پاکستانی... سەیری دەکات دەست بەرداری ببێت.

بێگۆمان پیاوانێك هەن، خۆیان لەناو دەمامکێکی زۆر قێزەون شاردۆتەوە، کاتێك هانی فیمینیستان دەدەن و پشتگیری خۆیانیان بۆ دەردەبڕن لە سەرکۆنەکردنی ئەم سیستمەی ناوی دەنێن پیاو سالاری، شەو و رۆژیش خەریکی بەنەفرەتکردنی شەرەفن، ئەم جۆرە پیاوانە بەردەوام قسەیەکی دووبارە دەلێسنەوە، گوایە پیاوی کورد شەرەفی خۆی تەنهاو تەنها لە نێوان هەردوو قاچەکەی ژن دەبینێ!

بێگومان ئەم جۆرە قسانە بە زمان ئاسانە، بەڵام کاتێك پەیوەندییەکی ناشەرعی لە نێوان کچ و خوشك و خێزانەکانیان لەگەڵ پیاوێکی بێگانە دروست دەبێ، ئەم جۆرە پیاوە دەمامك بەسەرە هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ پیاوێکی دەشتەکی نەخوێندەواری کۆلەوار، یاخود پیاوێکی کۆنەپارێزو ئاییندار نابێ، لە مامەڵکردنی لەگەڵ ئەم پەیوەندیە نا شەرعیەی دروست بووە.

سەیری دیمەنی هەڵوێستی ئەم پیاوە کوردە مارکسیە بکە لە وڵاتی بەریتانیا، کاتێك لەو وڵاتە بەناوی پاراستنی شەرەف کچەکەی خۆی دەکوژێت و تائێستاکەیش لە زیندانە.

بەم شێوەیە چارەسەر بۆ راگرتنی کوشتن بەناوی پاراستنی شەرەف چییە؟ لەراستیدا باشترین چارەسەر بەلای فیمینیستی کورد، وەکو ئەو کەسە وایە کە ناتوانێ ئامێری تەلەفزیۆنەکەی لە تێکچوونێك چاك بکاتەوە، لە داخان ئامێرەکەی دەداتە بەر شەق لێدان! لەبری ئەوەی بیر لە ئەنجامدانی توێژینەوەی کۆمەڵگەی کوردی بکاتەوە، فیمینیستی کوردی دێ، سەبەتەیەکی پڕاوپڕی لە تیۆرگەلێکی فیمینیستی رۆژئاوای بەکۆڵی خۆی داوە، بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان کە تائەوپەڕ دوورە لە رۆح و ژیاری کۆنتێکستی ئەم تیۆرانە.

# چارەسەری فیمینیزم بۆ کێشەی کوشتن

## بەناوی شەرەف چییە؟

بەبۆچوونی فیمینیستەکان دوو شێوە چارەسەری ماوە کورت و ماوە درێژ هەیە، بۆ چارەسەری ماوەکورت دەکرێ قوربانیەکە یاخود ئەو قوربانیەی کە چاوەڕوانی لێدەکرێ بپارێزرێ. هەرچی بۆ چارەسەری ماوەدرێژە بریتیە لە کوشتنی چەمك و زاراوەی کوشتن لە پێناو پاراستنی شەرەف لە کۆمەڵگەی کوردی و کارکردن بۆ گۆڕینی عەقڵیەتی خێزان و کۆمەڵگاکان، کە تاوانەکانی کوشتن بەناوی پاراستنی شەرەف تێیاندا ئەنجام دەدرێ.
لەم دۆخەشدا بەیەکجاری پیادەکردنی ئەم جۆرە تاوانە کۆتایی پێدێ. دەبێت فیمینیستی کوردی و هەموو جۆرە فیمینیستێکی دیکە ئەو راستیە بزانین سڕینەوەو لەناوبردنی زاراوەی شەرەف بەهێزی یاساو گرتن و سزای دیکە مەحاڵە.
وە لەبری ئەوەی بیر لە دروستکردنی نموونەی پیاوانێك بکەنەوە کە باوەڕیان بە شەرەف و غیرەت نەبێ، دەبێت بیر لە پەروەردەکردن و راستکردنەوەی ئەم جۆرە رەفتارە توندو تیژانەی وەکو کوشتن و شێواندن و سووتانی ژنان بکەنەوە، لەبەرامبەریشدا دەبێ ژنان بەشێوەیەکی هەستیار پابەندبن بەها گشتییەکانی کۆمەڵگا، کە پارێزگاری لە کەسایەتی و تەندروستی سنووری مەعقوڵی خۆی دەکات.
چونکە پرسی شەرەف هەر تەنها تایبەت نیە بە ژن، بەڵکو لادانی پیاویش لە رووی سێکسییەوە ئاکامی کوشتنی لێدەکەوێتەوە. راستە رێکخراوەکانی ژنان هەندێك سەرکەوتن لە رۆژئاوا تۆمار دەکەن، بەڵام گواستنەوەی ئەم سەرکەوتنانە بۆ رۆژهەڵات و دووبارەکردنەوەی هەمان ئەزموون بۆ کۆمەڵگەکانی ئەم ناوچەیە کارێکی گەمژانەیە.
لەراستیدا بەبۆچوونی ئێمە چەمکی شەرەف لای پیاوی رۆژهەڵاتی سەرچاوەکەی لەو باوەڕە قووڵە وەرگرتووە کە بە خودا هەیەتی، پێشتر هەروەك چۆن تەواوی فەلسەفەی ئیلحاد لەسەرووی هەمووشیانەوە مارکسی بەکۆی لق و پۆپەکانیەوە کە بانگەشەیان بۆی دەکرد، نەیتوانی باوەڕ لە دڵ و دەروونی مەسیحی و موسڵمانان دەربێنێ، بەو فشارە زۆرە و دەسەڵاتەیەوە! بەهەمان شێوە فیمینیزم هەرگیز ناتوانێ کۆمەڵگای رۆژهەڵاتی بەو دۆخە ببات و دەستبەرداری چەمکی شەرەفی بکات.

## تاوانەکانی سۆزداری دیویێکی دیکەی تاوانەکانی شەرەف!

راستە لە رۆژئاوا تاوانێك نیە بەناوی تاوانی شەرەف، بەڵام تاوانی دیکە هەن کە لەگەڵ تاوانی شەرەف لە رۆژهەڵات دوو رووی دراویێکن و ناودەنرێ بە تاوانی سۆزداری **passion of crimes**، ئەم تاوانە لەکاتی لەناکاوو تورەیی پیاوان روودەدا، کاتێك دەبینێ هاوسەرەکەی یا کچەکەی یانیش هاورێکەی ناپاکی لەگەڵدا کردووە، شاراوە نیە ئەم جۆرە تاوانە لە رۆژئاوا بەتایبەت لە ئەمەریکای لاتین زۆر باو و پەرەسەندووە.

لە ئەمەریکای لاتیندا ئەم تاوانانە ئاماژەیەکن بۆ کوشتنی دەستگیران یاخود بۆ سووتاندنی بووك، ئەم تاوانانەش هاوتا دەکرێن بە تاوانەکانی شەرەف، وەکو چۆن تاوانەکانی شەرەف لەلایەن ئەندامانی خێزانێکەوە ئەنجام دەدرێ، بەهەمان شێوە تاوانەکانی سۆزداریش لەلایەن مێرد، یاخود ئەندامێکی خێزان، یانیش لەلایەن هاورێکەی **Boyfriend** وە ئەنجام دەدرێ، هەروەها زۆربەی جارانیش ئەنجامدانی ئەم جۆرە تاوانانە چاوپۆشی لێدەکرێ.

بڕوانە لە وڵاتی پیرۆ 70**%** ی کوشتنی ژنان لەلایەن مێردەکانیانەوە یاخود هاورێکانیانەوە بووە، زۆربەی هۆکارەکانیش پەیوەست بوونە بە غیرەو گومانی خراپی پیاوان، یانیش نەبوونی متمانەو دڵسۆزی. (15) لە وڵاتی بەریتانیا پیاوێك کە لە دوورەوە عاشقی "کاتی پیپەر" بوو، کە ناوبراو یەکێك بوو لە ژنە بەناوبانگەکانی ناو راگەیاندنی وڵاتی بەریتانیاو هاوکات نمایشکارێکی دەگمەنیش بوو، لە چوارچێوەی تاوانی سۆزدارییەوە پەلاماری داو بە مادەی ئەسید رووخساری سووتاندوو جوانییەکەی شێواند.

لەسەرێکی دیکەوە داتاکان دووپات لەسەر ئەوە دەکەنەوە، کە جیاوازییەکی زۆر هەیە لەرێژەی کوشتنی ژنان لە رۆژئاواو ئەوەیشی لە وڵاتانی ئیسلامی و رۆژهەڵات بەگشتی روودەدات، لەمبارەیەوە "دافی پارکەر" لە وتارێکدا نووسیویەتی: سندووقی دانیشتووانی سەر بەنەتەوە یەکگرتووەکان ئاماژەی بەوەداوە، کە لەسەرتاسەری جیهان 5000 ژن و کچ لەسەر دەستی ئەندامانی خێزانەکانیانەوە کوژراون، کەواتە کوشتنی ئەم ژمارە زۆرە لەسەرتاسەری بەتەنها لەسەردەستی موسڵمانان روونەداوە، بەڵکو ئەم داتایە رێژەی کوشتنی ژنانی لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاش تۆمارکردووە، هەروەها راپۆرتەکە روونی کردووەتەوە زۆربەی کوشتنەکان بەناوی تاوانی شەرەفەوە ئەنجام دراون، بەڵام چۆنییەتیەکەی روون نەکردووتەوە.

ئێستا با تاوتوێی ئەم بابەتە بکەین، ئەگەر وادابنێین 5000 ژن و کچ لەسەردەستی خێزانە

موسڵمانەکانەوە کوژراون، کە هەرگیز راست نییە، بەڵکو بەگوێرەی راپۆرتی کۆڕبەندی "پیو" سەبارەت بە ئایین و ژیانی گشتی **The pew forum on religion and puplic life** ژمارەی موسڵمانان لە جیهان بریتیە لە ملیارێك و **57** ملیۆن، کە دەکاتە رێژەی **25%**ی دانیشتووانی گۆی زەوی، بەم شێوەیە ساڵانە لە هەر ملیۆنێك ژنی موسڵمان٣،٢ ژن لەسەردەستی خێزانەکانیان دەکوژرێن، بەگوێرەی راپۆرتی **FBI** رێژەی کوشتن لەناو خێزانەکان بەشێوەیەکی زۆر پەرەیسەندووە، بەجۆرێك تەنها لەماوەی ساڵی **2008** ژمارەکەی گەیشتووەتە ١٤١٨٠ کەس، لەکۆی ئەم ژمارەیشدا ژمارەی ژنە کوژراوەکان کە لەلایەن خێزانەکانیانەوە کوژراون ٩٣٠ ژن بووە، لە کاتێکدا لە ساڵی **2008** ژمارەی دانیشتووانی ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا ٣٠١ ملیۆن کەس بووە. بەو پێیە ساڵانە لە هەر ملیۆنێك ٣،١ لە ژنانی ئەمەریکا بەدەستی خێزانەکانیان دەکوژرێن. دەرەنجام روون دەبێتەوە جیاوازییەکە لە هەردوو رێژەی کوشتن لە ولاّتانی ئیسلامی و ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بریتیە لەوەی لە ولاّتانی ئیسلامی لە **10** ملیۆن کەس ژنێك دەکوژرێ، لەو کاتەی لە ولاّتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا لە **3** ملیۆن کەس ژنێك دەکوژرێ.

بەشی حەوتەم

# ڕۆڵی نەرێنی میدیای خۆرئاوایی لە کێشەی ئافرەتاندا

لەراستیدا وەك ئەوەی کە بزووتنەوەکانی ژنانی رۆژهەلاّت ئاماژەی پێدەکەن، میدیاو فیمینیزمی رۆژئاوا رۆڵێکی نەرێنی گەوەر دەگێرن، بە ئامانجی بەلاڕێدابردن و شێواندنی وێنای راستەقینەو هاندانی ژنان لەسەر بنەماو لۆژیکی ململانێ، لەبری هاندانیان بە ئامانجی دۆزینەوەی باشترین رێگا بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەکانیان.

لەراستیدا کوشتنی"فاتیمە ساهێندالْ" کچە کوردی باکوور، کاردانەوەی هاوچەشنی لێکەوتەوە، بێئەوەی راستەقینەی رووداوەکە دەربخەن، بەڵکو هەموولایەنەکان تەنها سەرکۆنەی کوشتنەکەیان کرد، بگرە هەندێکیان لەپاڵ کوشتنەکەدا هێرشیان بۆ سەر رکابەرەکانیان دەکرد، کە لەرووی ئایدۆلۆژیاوە لە یەکتری جیاواز بوون، هەر یەکە لە رۆژنامەگەری سوێدو میدیای ئەسکەندەنافیا بەگشتی، هاوکات لەگەڵ رووداوەکانی 11 ی سێپتمبەری 2001 دەستیان کرد بەهێرش کردنە سەر بەها ئیسلامییەکان، بەشێوەیەك داوایان کرد پەلە بکرێ لە پرۆسەی ئینیدماج و ئاوێتەکردنی کۆمەڵگا کۆچکەرەکان بە کۆمەڵگاکانی خۆرئاوا

تواندنەوە و ئامێتەکردنی پەناهەندەی وڵاتانی ئەوروپاو رێگەیان پێنەدرێ پیادەی داب و نەریت و بەها ئایینیەکانی تایبەت بەخۆیان بکەن، بەم شێوەیە هەر یەك لە میدیای سویدو فیمینیستانی سوید، رۆڵێکی گەورەیان بینی لە کۆتایی پێهێنان بە ژیانی "فاتیمە"، ئەو کچەی لە هەموو داب و نەریت و بەهایەکی ئاینی تایبەت بە خێزانەکەی هەڵگەڕایەوە، کوڕە گەنجێکی مەسیحی سویدی کردە دۆستی خۆی، لەبەرامبەریشدا خێزانەکەی فاتیمە ئەم هەڵوێستەی قبوڵ نەکرد.

لەراستیدا رۆژنامەگەری سویدی، و فیمینیستانی کوردی و سویدیش زیاتر هانی "فاتیمە" یاندا، بۆ بەرەنگاربوونەوەی خێزانەکەی، بەشێوەیەك سکاڵای لەسەر خێزانەکەی خۆی بەرزکردەوە، بەو هۆیەوە

